

# دەسەڵاتی چوارەم

کەمال سەعدی

١٩٩٨

# دەسەڵاتی چوارەم




**کەمال سەعدی**
**مامۆستای یاسای تایبەت**
**کۆلێژی یاساو رامیاری زانکۆی سەلاحەددین**

**پێشکەشە :**

● بەو مرۆڤە مەزنەی کە هاوکاریم دەکات بۆ تەواوکردنی خوێندنی دکتۆرا... جارێ نازانم کێیە !!

● بەو لێپرسراوەی کە لە ڕۆژنامەی ئازاد دەترسێ.

بەر لەوەی بچینە سەر باسی ڕۆژنامەگەری ئازاد و ئازادی ڕۆژنامەنووسان پێویستە ئەوە بڵێین ئایا چ ڕۆژنامەیەک و ڕۆژنامەنووسێک ئازادەو لە کوێ؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێ لە چەمکی دیموکراسییەت و مافی مرۆڤەوە دەست پێ بکەین چونکە تەنیا ڕۆژنامەگەری ئازاد لە وڵاتە دیموکراسییەکان دەتوانێ ببێتە دەسەڵاتی چوارەم.

لەبەر ئەوەی ئازادی ڕۆژنامەگەری بە گرینگترین ڕواڵەت دادەنرێ لە ڕواڵەتەکانی ئازادی بیروڕاو ڕادەربڕین کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا مافێکە لە مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ بۆیە دەبێ بە تێروتەسەلی باسی مرۆڤیش بکەین چونکە پێوەندییەکی زۆر بەتین لە نێوان مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ و دیموکراسییەت هەیە هەروەها ئەم دوو چەمکەش پێوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە ئازادی ڕۆژنامەگەری و ئەو دەسەڵاتی چوارەمەوە هەیە.

## مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ: Human rights

هەر لە کۆنەوە تا ئێستا مشت و مڕێکی زۆر لەبارەی سەرچاوەو جۆرەکانی ماف کراوە و دەرئەنجام چەندین تیوری جۆراو جۆر بۆ شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی ماف هاتونەتەکایەوە.

هەندێک لەو تیۆرییانە دەڵێن سروشت سەرچاوەی مافە، هەندێکی تریشیان دەڵێن خوداوەند خاوەنی گشت مافێکە و بە پێ بەخشین دەیداتە مرۆڤ. هەندێکی تریشیان بە پێچەوانەی هەر دوو کۆمەڵەکە وای بۆ دەچن کە دەوڵەت تاقە سەرچاوەی ماف بێت بۆیە

بەلای ئەوانەوە ماف لەسەر یاسا بنیات دەنرێت و بە بێ یاسا شتێک نییە ناوی ماف بێت. بەهەرحاڵ، ئەگەر ئەمە مشت و مڕی یاسازانان بێت لە بارەی بوون و نەبوونی مافەوە ئەی دەبێ لەبارەی بەش و جۆرەکانی مافەوە چی بڵێین.

لە واقیعدا مرۆڤ تەوەری گشت مافێکە بۆیە نەماف بەبێ مرۆڤ بەدی دەکرێ و نە مرۆڤیش بەبێ ماف، بۆیە دەتوانین بڵێین ماف و مرۆڤ بەیەکەوە بەندن. کەواتە لە ئەسڵدا ماف بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ هاتۆتە کایەوە، بەڵام کە هەندێ جار لە مافەکەی کەم دەکرێتەوە یان دەستی لە بەرجەستە کردنی هەندێک لەو مافانە دەبەسترێتەوە ئەوە مانای ئەوە ناگەیەنێ کە دژی بەرژەوەندی ئەو مرۆڤەیە بەڵکو بە پێچەوانەوە بەربەستەکانی رێگای پرۆسەکردنی ماف لەبەرژەوەندی مرۆڤەکەدایە، چونکە مرۆڤ خۆی بە پێی سروشتەکەی شارستانییە هەر بۆیەش لەگەڵ مرۆڤەکانی دەوروبەریدا رێکەوتنێکی بەستووە بە رێکەوتنی کۆمەڵایەتی ناو دەبردرێ بە پێی ئەم رێکەوتنە واز لە هەندێ مافی خۆی دەهێنێ بۆ کۆمەڵ لە بەرامبەر رێزگرتن و پاراستنی پاشماوەکەی بە مەبەستی رزگار بوون لە دژە مافێکیدا، چونکە ئازادی هەر کەسێک لەو شوێنەوە دەست پێ دەکات کە ئازادی کەسەکەی تری لێ کۆتایی دێت. جا بۆ ئەوەی ئەو ئازادییانە رێک بخرێن دەبێ رێکەوتنی کۆمەڵایەتی گرێ بدرێ، زانیمان ماف چییە، ئەی کەواتە مافی مرۆڤ چییە؟

هەروەک لەوەو پێش وتمان مرۆڤ تەوەری گشت مافێکە کەواتە مرۆڤ و ماف بەبێ یەکتر هەڵناکەن، بەڵام سەرەڕای ئەم پێوەندییە

به تینه هەندێک ماف هەن بە گوێرەی مرۆڤ سەرەکین و ناکرێ قەت و قەت دەستیان لێ هەڵبگیرێ، بەڵام لە هەمان کاتدا هەندێ مافی تریش هەن ناسەرەکین و ناسانە وازیان لێ بهێنرێ چونکە هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنێ. ئەو کۆمەڵە مافە سەرەکییانە پێیان دەوترێ مافی مرۆڤ.

لەراستیدا مافی مرۆڤ و مافی سروشتی و مافی شارستانی هەر هەموویان لە ناوەڕۆکدا یەکن، بەڵام لە ناوەکەیاندا لێک جیاوازن.بە پێی قسەکانی **(شیشرون و تۆماس ئەکوین و ئەرستۆ)** سەرچاوەی مافی سروشتی ئەو یاسایەیە کە چەسپاوو نەگۆڕە و نەمرە، ناگۆڕێ بە گۆڕانی کات و شوێن، لەسەر هەموو کەسێک دەچەسپێ لە هەر شوێنێک بێ، لێرە بێت یان لە ئەوێ، ئەو یاسایە یاسای سروشتییە، مرۆڤ لە ڕێگای ئەقڵییەوە ئەحکامەکانی ئەم یاسایە لە سروشت دەرک پێ دەکات و دەیان دۆزێتەوە.

ئێمەش دەڵێین، ئەگەر یاسایەک هەبێ ناوی یاسای سروشتی بێت و مافێکیش هەبێ ناوی مافی سروشتی بێ ئەوا بێگومان دانەرەکەی خودای گەورەیە و لە دوو توێی بەرگێکی ئەشەنگدا ئەحکامەکانی ئەم یاسایە دەرک پێ دەکەین کە ئەویش قورئانی پیرۆزە.

بەهەرحاڵ، هەندێ جار کەم کردنەوەی بەشێک لەم مافە سروشتییانە دەبێتە مایەی زیان پێگەیاندن بە کەرامەتی مرۆڤ و دژی بەرژەوەندییەکانیەتی بەم پێیە کەم کردنەوەی بڕێک لەو مافانە دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی بڕێک لە بەها مرۆڤایەتییەکەی و

دەتوانین بە مرۆڤێکی ناتەواوی ناوبنێین، بەڵام بە پێچەوانە، چەندی ئەو مافانەی بێ کەم و کوڕی بن ئەوەندە ئەو مرۆڤە مرۆڤایەتییەکەی تەواو دەبێ. هەر لەبەر ئەمەیە ئەو کۆمەڵە مافەی لە جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ لە ساڵی (١٩٤٨)دا هاتوون بە کەمترین بڕی پێویست بۆ مرۆڤ دادەندرێن هەر بۆیەشە ناویان لێ ناون مافی مرۆڤ. بۆیە هەر دەست درێژی کردنێک بۆ سەریان دەبێتە هۆی دەست درێژی کردن بۆ سەر مرۆڤ. بۆ نموونە، ڕێگا گرتن لەبەردەم مافی بیروڕا دەربڕین و مافی هەڵبژاردن و مافی پەروەردەو فێرکردن خۆی لە خۆیدا کەم کردنەوەیە لە کەسایەتی مرۆڤ.

هەر وەک لە پێشەوە وتمان ئەم مافە سەرەکییانە بەستراونەتەوە بە سروشتی مرۆڤ و بەها مرۆڤایەتییەکەی و کۆمەڵ هەڵدەستێ بە ڕێکخستنیان بە جۆرێک کە لەگەڵ کۆمەڵگاو ئەو بارودۆخەدا بگونجێ کە لە چواردەورەی ئەو کۆمەڵگایەدایە. بۆیە لە هەر وڵاتێکدا یاسا سنووری مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ دیار دەکات و هەر ئەمەشە کاکڵی جیاوازی لە نێوان ئەم مافانەو ئەوانەی لە جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤدا هاتوون ئەو جاڕەی کە لە ڕێکەوتی ١٩٤٨/١٢/١٠ دوای جەنگی جیهانی دووەم لەلایەن نەتەوەیەکگرتووەکانەوە ڕاگەیەندرا.

ئەمەو سەرەڕای ئەوەی جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ تا ئێستا نەبۆتە جاڕنامەیەکی بە زۆرەکی و دەتوانین بڵێین لە زۆربەی وڵاتان کاری پێ ناکرێ.

ئەوەی شایەنی باسە، مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ پێوەندییان بە قەوارەی کەس و پێوەندی بە کەسانی ترەوە لەناو کۆمەڵ هەیە. بۆیە دەتوانین بڵێین کەس ناتوانێ گشت مافەکانی بە تەواوی و بێ کەم کوڕی وە دەست بهێنێ مەگەر لەژێر سێبەری سیستمێکی دیموکراسی راستەقینەدا.

بۆیە سیستمی دیموکراسی خۆی بە تەنیا زامنی ئەم مافانە بۆ تاکەکانی کۆمەڵ دەکات و سنووریشیان بۆ دادەنێت هەر وەک لەمەولا لە باسی دیموکراسیەت بە درێژی باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین.

لە راستیدا، بیرۆکەی مافی سروشتی کە مافی مرۆڤیش دەگرێتەوە لە لایەن لایەنگرانی رێچکەی تاک پەروەرەوە لە ئەوروپا پەیدا بوو، تیۆری رێکەوتنی کۆمەلایەتی هەروەها بیروباوەڕەکانی قوتابخانەی یاسای سروشتی کارێکی زۆری کردبووە سەر لایەنگرانی رێچکەی تاک پەروەر کە بە پێی ئەو تیۆری و بیروباوەڕانە مرۆڤ ئازادی و مافەکانی لە سروشتە مرۆڤایەتییەکەی وەردەگرێ و هەر لەو کاتەی کە کۆرپەلەیە و لەناو سکی دایکیدایە تا ئەو رۆژەی دەبێت و دەمرێ پێیەوە لکاوە.

هەربۆیە لایەنگرانی رێچکەی تاک پەروەر بۆ قسەکانیان پاساویان بە جاری ئەو مافانە هێنایەوە کە لە لایەن ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دوای سەربەخۆ بوونی لە کۆنگرەی فیلادلفیا لە سالی (١٧٧٦) و ئەو جار نامەیەی مافی مرۆڤ کە شۆڕشی فەرەنسا لە سالی (١٧٨٩) دەری کرد هەروەها جاری

گەردونی مافی مرۆڤ کە نەتەوە یەکگرتووەکان لە سالی (١٩٤٨) دەری کرد.

سەرەڕای ئەمانە دەتوانین بلێین ئەو ماف و ئازادییانەی کە لکاون بە مرۆڤەوە ئەوانەن کە لە یاسای سروشتی وەرگیراون وەک ئازادی هزرو ئازادی بیروباوەڕ و ئایین و ئازادی بیروڕاوورادەربڕین و ئازادی رۆژنامەگەری....... تاد

مافی ئەدەبی و هونەری (هزری) ناوەڕۆکەکەی شتێکی نابەرجەستەیەو بە پێچەوانەی مالاتە بەرجەستەکان وەک بیرۆکەیەک لەناو دەروونی خاوەنەکەیان شاراوەن و تاقە رێگا کە بە هۆیەوە سوود لەو مالاتانە وەربگیرێ رێگای بیروڕاو را دەربڕینە چونکە بە شاراوەیی لە دەروونی خاوەنەکەی هیچ بایەخێکی نییە ئەگەر بێت و تەعبیری لێ نەکرێت و نەخرێتە سەر کاغەز یان پەخش و بلاو نەکرێتەوە.

کەواتە چۆن هەموو کەسێک مافی بەسەر مالاتە بەرجەستەکانیدا هەیە وەک مافی جوتیار بەسەر زەوییەکەی و بەکرێدەر بەسەر بەکرێدراوەکەی ئەوهاش هەموو مرۆڤێک مافی بەسەر مالاتە مەعنەوییەکان یان نابەرجەستەکانیدا هەیەو هیچ کەسێک یان کۆمەلێک یان دەولەتێک بۆی نییە رێگا لەبەردەم ئەم ئازادییانەیدا بگرێت. هەروەک لە دەقی مادده (١٩)ی جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤدا هاتووە: **«هەموو کەسێک مافی ئازادی بیروڕاو رادەربڕینی هەیە»** هەروەها لە ماددەی (٣٠) هەمان جاڕنامەدا هاتووەو دەلێ: **«هیچ دەقێکی ئەم بانگەوازە نابێت وا**

**لێکبدرێتەوەکە رێگە دەداتە دەوڵەتێک یان کۆمەڵێک یان تاکە کەسێک کە چ مافێکی ئەوەیان هەبێت کە چالاکی یان کارێک بکەن بە مەبەستی تێکدانی ماف و ئازادییەکانی نێو ئەم بانگەوازە».**

ئەوەی شایەنی باسە، ئازادی بیرورا دەربڕین تەواوکەری ئازادی هزرو ویژدان و بیروباوەڕە، بۆیە ئەم ئازادییە ناتەواو دەبێت ئەگەر بێت و مرۆڤ نەتوانێ لە کۆڕە گشتی و تایبەتییەکانیان لە رێگای خوتبەدان یان بەیاداشتنامەو نووسین و پەخش و بڵاو کردنەوە تەعبیر لە بیروڕاو هزرەکانی بکات.

کەواتە، بە هیچ شێوەیەک و بڕوبیانوێک نابێت رێگا لە بیروڕای ئازاد بگیرێت و هەر دەست درێژییەکیش بۆ سەر ئەم مافە دەست درێژییە بۆ سەر تاک و کۆمەڵ بەیەکەوە چونکە بەم کارە دژێوە تەگەرە دەخرێتە سەر پێشکەوتنی کۆمەڵ و وەبەرهێنانی تەواوی بەرهەمە فیکرییەکانی مرۆڤ.

**هەر بەم بۆنەیە ڤۆلتێری بلیمەت دەڵێ: «من نارەزایی لە دژی قسەکانت دەردەبڕم، بەڵام تا مردن بەرگری لە مافەکەت دەکەم سەبارەت بە وتنی ئەم قسانەت».**

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە بە هیچ شێوەیەک نابێت رێگا لە بیرورا دەربڕین بگیرێت بەڵکو دەکرێ ئەو کەسەی بە دڵی نییە نارەزایی خۆی بە قسەو نووسین بۆ دەربڕێت. هەر بەم بۆنەیەوە دەستووری وڵاتان ئەم مافەیان لەژێر ناونیشانی مافە گشتییەکان یان ئازادییە سەرەکییەکان رێکخستووە لەوانە پرۆژەی **دەستووری**

**عێراقی ساڵی ١٩٩٠ کە ماددەی (٥٣)ی بۆ تەرخان کردووەو تیایدا هاتووە: «ئازادی بیرورِاو تەعبیر کردن لێیمان بە رێگاکانی راگەیاندن و رۆشنبیری زامنەو یاسا چۆنێتی پرۆسە کردنی ئەم ئازادییانە رێک دەخات». هەروەها لە ماددە (٦٣)ی دەستووری عێراقی ١٦/٧/١٩٧٠ داهاتووە: «دەستوور کەفالەتی ئازادی بیرورِاو بڵاوکردنەوە دەکات».**

شایەنی باسە، ئیسلام داواو کەفالەتی ئازادی بیرورِا دەربرینی کردووەو بە ماف و ئەرکی لە هەمان کاتدا داناوەو پارێزگاری یاساییشی بۆ دابین کردووە، بەڵکو یەکێک لەو پرینسیپانەی کە لقی ئەم مافەن کردوویەتییە بنچینەیەکی سەرەکی لە کۆمەڵگای ئیسلامی کە ئەویش پرینسیپی «فەرمان کردن بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە»یە.

بەڵگەی ئازادی بیرورِا دەربرین لە قورئانی پیرۆزەوەیە، خوای گەورە لەو بارەیەوە لە سورەتی ئال عومران لە ئایەتی (١٠٤)دا دەفەرموێ: **«ولتكن منكم امة يدعون الى الخير ويأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر».** ئەم ئازادییەش گەلێک لق و پۆپی سەرەکی لێ دەبێتەوە، لەوانە ئازادی بیر کردنەوەو ئیجتهاد کردن لە مەسەلە شەرعییەکان و کاروباری فقهیدا لەو حاڵەتانەدا کە دەقێک لە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) دەست نەکەوێ بە مەبەستی چارەسەر کردنی ئەو تەنگ و چەڵەمانەی کە دووچاری موسڵمانان دەبێ لە رووبەڕوو بوونەوەی ئەو پێشکەوتنە یەک لە دوایەکانە کە لە کاروبارەکانیاندا رووبەڕووی دەبنەوە.

هەر بەم بۆنەیە دەگێڕنەوە جارێکیان عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) لە کاتی خوتبە خوێندندا ڕوودەکاتە خەڵکەکەو دەڵێ: **«ئەی خەڵکینە هەر کەسێک لە ئێوە ئەگەر خواری پێوە بینیم با ڕاستم بکاتەوە»**. یەکێک لە دانیشتووان وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: **«بەخوا ئەگەر خوارییان پێتەوە بینی بەو شیرە ڕاستت دەکەینەوە»**. عومەری کوڕی خەتاب وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: «ستایش بۆ خوا کە وای کردووە لە نێو موسڵمانانداندا یەکێک هەبێت بە شیرەکەی خواری عومەر ڕاست بکاتەوە». لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە تاچ ڕادەیەک ئیسلام پەرۆشی ئازادی بیرورا دەربڕین بووە تا دەرهەق بە خۆشی.

## دیموکراسییەت Democratiec

زاراوەی دیموکراسییەت لە دوو وشەی ئەغریقی پێک دێت de-mos بە مانای گەل وە Kratos بە مانای دەسەڵات واتە دەسەڵاتی گەل.

ئەوەی شایەنی باسە، سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم سیستەمە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شاری (ئەثینا) ئەو کاتەی کە گەل بە تێکڕا حوکمڕانێتی شاری ئەثینایان دەکرد و بۆ دەرکردنی بچووکترین بڕیار جاڕیان دەدا و لە ناوەڕاستی گۆڕەپانی شار کۆ دەبوونەوە و دوای وتوێژو دەنگ دان بەزۆرینەی دەنگ بڕیاری گونجاویان بۆ هەر کێشەیەک لە کێشەکان دەردەکرد، ئەم جۆرە دیموکراسییەتەش پێی دەوترێ دیموکراسیەتی ڕاستەوخۆ، بەڵام دوای


جان جاك رۆسۆ

فراوان بوونی شارەکان و زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانی ئەم ولاتانە کۆبوونەوەی گەل لە دانیشتنێکی یەکگرتوودا شتێکی ئاسان نەبوو بۆیە لە قۆناغی دووەمدا گەل لە ریگای پرۆسەی هەلبژاردن نوێنەری خۆی هەلبژاردو لە ریگای ئەم نوێنەرانەوە حوکمرانێتی خۆی دەکرد کە ئەمەش پێی دەووترێ دیموکراسییەتی ناڕاستەوخۆ.

بە هەرحال، ئەگەر دیموکراسییەتەکە راستەوخۆ بێت وەیان ناڕاستەوخۆ هەر وەک سەرۆکی پێشووی ئەمەریکی ئەبراهام لنکۆلن دەلێ: دیموکراسییەت بریتییە لە حوکمڕانێتی گەل بە گەل و بۆ گەل.

واتە گەل سەرچاوەی گشت دەسەلاتەکانە لە ولاتدا. کەواتە گەل سەرچاوەی گشت دەسەلاتەکان دەبێ ئەگەر بێت و دیموکراسییەت بەرقەرار بێت و دیموکراسییەتیش بەرقەرار دەبێت ئەگەر بێت و هەلبژاردنێکی ئازاد و پاک و بێگەرد لە کەشوهەوایەکی هێمن و ئاسوودە لە ئارادا بێت.

کەواتە دیموکراسییەت قەت لەگەل دیکتاتۆرییەت بە یەک ناگەن و باشترین سیستەمیش بۆ ریزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ کە مافی ئازادی بیروڕا دەربڕین و ئازادی رۆژنامەگەری و دەیان مافی تری سەرەکی دەگرێتەوە. بە پێچەوانەشەوە ئەم مافە سەرەکییانەی مرۆڤ لە سیستەمی دیکتاتۆرییەت و ئیستبدادی و پاشایەتی رەهاو سیستەمی مەرکەزی و دیموکراسییەتی مەرکەزیدا پێشێل دەکرێت.

لە سەدەی هەژدەیەمدا دیموکراسییەتی لیبرالی لەسەر دەستی هزرمەنداتی سەری هەلدا لەو کاتانەدا کە مزگێنی یەکسانی مرۆڤیان راگەیاندو داوای مافی گەلانیان بۆ هەلبژاردنی نوێنەرانیان کرد بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ولات. هەربۆیە هەندێک هزرمەند دەلێن ئەگەر دیموکراسییەت بەرقەرار بێت مافی مرۆڤ بە ئۆتۆماتیکی بەرقەرار دەبێت چونکە دیموکراسییەت خۆی لە خۆیدا یەکسانی گشت تاکەکانی گەلە لە ماف و ئەرکەکاندا.

کەواتە دەولەتی دیموکراسی ئەو دەولەتەیە کە تێیدا شکۆمەندی تەنیا بۆ گەلە بەبێ جیاوازی کردن لە نێوانیان چونکە گشتیان لە ماف و ئەرکەکاندا یەکسان و ئازادن. لەم بارەیەوە جۆرج بۆردۆ دەلێ: **«دەولەتی دیموکراسی دەولەتی مافە، تیایدا مافەکان پارێزراوە بۆ هەموو کەسێک لە سنووری یاسادا».**

لەمەی سەرەوە ئەوەیان بۆ دەردەکەوێ کە دەولەتی دیموکراسی ئەو دەولەتەیەکە بتوانێ پێداویستییەکانی ئازادی بیروڕا دەربڕین بخاتە بەردەست رۆلەکانی چونکە دیموکراسییەت و ئەو ئازادییانە کەمترین بڕی پێویستن بۆ مرۆڤ.

دەبێ تەنکید لەسەر ئازادی بیروڕا دەربڕین و ئازادی پەخش و بلاو کردنەوە و رۆژنامەگەری بکرێ، چونکە ئەم ئازادییانە تەواوکەری دیموکراسییەتن و دەبنە هۆی بەردەوام بوونی پێوەندی نێوان گەل و حوکم بە دەستان نەک تەنیا لە کاتی هەلبژاردنی گشتیدا بەلکو هەموو کاتێک.

لێرەدا رۆلی رۆژنامەگەریان وەک دەسەلاتێکی سەربەخۆ

جیاواز لە سێ دەسەڵاتەکەی تر (یاسا دانان و جێ بەجێ کردن و دادگا) بەرچاو دەکەوێ، بەڵام ئایا بە هەقیقەت رۆژنامەگەری ئەو دەسەڵاتەیە یان نا؟ ئەمە مەسەلەیەکی ترەو تۆزێکی تر باسی لێوە دەکەین.

دیموکراسییەت وەسلەیەکە بۆ دروست کردنی زمانێکی هاوبەش لە نێوان حوکم بەدەستان و چینی گشتی. مەبەستمان ئەو حوکم بەدەستانەیە کە دەسەڵاتی وڵاتیان گرتۆتە دەست و ئەو چینە گشتیەش کە سوورن لەسەر داکۆکی کردن لەسەر مافەکانیان. هەربۆیە ئەم دوولایەنە هەرگیز بەبێ یەک هەڵناکەن و لە دوو خەندەقی جیاوازدا نابن بەڵکو بەیەکەوە و لەیەک خەندەق دەبن بۆ وتوێژو راوێژ کردن بۆ بەرژەوەندی پێداویستییەکانی ماف و ئازادی.

هەروەها دیموکراسییەت دەبێتە هۆی دروست کردنی جۆرە هاوکاری و هاوبەشییەک لە چاودێری و بەڕێوەبردنی کاروبارە گشتییەکانی وڵات و دامەزراندنی دەزگاکان. هەروەها دەبێتە هۆی دروستکردنی جۆرە بەرهەڵستی کردنێکی رەوای دەسەڵات. لە راستیدا، گفتوگۆو هاوکاری و بەرهەڵستکاری وەک چەمکێکە کە بوونی ئەم چەمکەش کەشوهەوایەکی لەبار دەخوازێ. بۆ نموونە، گفتوگۆ پێویستی بە زیاتر لە لایەنێکە، هەروەها هاوکاری کردن و بەرهەڵستی کردن. هەر لەبەر ئەمەش دیموکراسییەت پابەندی فرەیی (تعددیە)یە. فرە حزبی و فرە رای گشتی و فرە دەسەڵاتی کە پێشی دەڵێن پرەنسیپی لە یەک جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان (مبدأ الفصل بین السلطات).



شیشرۆن

ئەوەی شایەنی باسە، پرەنسیپی لێک جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان (دەسەڵاتی یاسادانان و جێ بەجێ کردن و دادگا) Principe de separation des prouroirs بەستراوەتەوە بە ناوی هزرمەندی فەرەنسی مۆنتسکیو Montesquieu کە توانی تیشکی بخاتە سەر وەک پرەنسیپێکی بنەڕەتی بۆ ڕێکخستنی پێوەندی لە نێوان دەسەڵاتە گشتییەکانی ناو دەوڵەت و ڕێگاگرتن لە خراپ بەکار هێنانی دەسەڵات (منع الاستبداد بالسلطه).

هەر لەم روانگەیەوە (مۆنتسکیو) دەڵێ ئەگەر بێت و دەسەڵاتی یاسادانان و جێ بەجێ کردن بخرێتە ژێر دەستی تاقە کەسێک، یان بخرێتە ژێر کۆنترۆڵی دەستەیەک ئەو کاتە ئازادی کۆتایی پێ دێت، چونکە ئەو کەسە یان ئەو دەستەیە هەڵدەستێ بە دانانی یاسای ئیستبدادی، هەروەها بە ڕێگایەکی ئیستبدادیش جێ بەجێیان دەکات.

لەبەر ئەوەی پرەنسیپی لێک جیا کردنەوەی دەسەڵاتەکان بە شێوەیەکی رەها مەحاڵە و نایەتەدی بۆیە ئەمە بووە هۆی سەر هەڵدانی پرەنسیپێکی تر، ئەویش پرەنسیپی هاوسەنگی و چاودێری ئاڵوگۆڕە «الرقابه المتبادله» کە لە ڕێگایەوە دەتوانرێ هەر یەکێک لەو دەسەڵاتانە پێوەندی بەوەی تریان بکات، هەروەها

توانای ئەوەی پێ دەبەخشێ کە لە سنووری تایبەتمەندێتییەکەیدا رایبگرێت.

بەر لەوەی پێوەندی نێوان دیموکراسییەت و مافی مرۆڤ روون بکەینەوە بە چاکی دەزانین تشکێک بخەینە سەر سەرهەڵدانی چەمکی دیموکراسییەت و پێوەندی بە رێکەوتنی کۆمەڵاتییەوە.

ئەوەی شایەنی باسە، لە ئەنجامی توندو تیژی و زەبرو زەنگی پاشاکان لە چاخەکانی ناوەڕاستدا بیرۆکەی رێکەوتنی کۆمەڵایەتی پەیدا بوو لە لایەن ئەو کەسانەوە کە داکۆکیان لە مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ دەکرد و بەرهەڵستی ئەو دەسەڵاتە توندو تیژە رەهایەی حاکمەکانیان دەکرد. لە راستیدا لێکدانەوەی بیرۆکەی ئەم رێکەوتنە سێ شێوەی وەرگرتووە بە پێی تیڕوانینی هەر یەکێک لە هزرمەندان هۆبزو جۆن لۆک و جان جاک رۆسۆ. ئەوەی بە لای ئێمەوە گرینگە لێک دانەوەی جان جاک رۆسۆیە کە وای بۆ دەچێ کە گەل سەرچاوەی گشت دەسەڵاتەکانە لە وڵاتدا.

بە پێی بۆچوونی رۆسۆ **J.J. Rousseau** تاکەکانی گەل لە نێوان خۆیاندا رێکەوتنێکیان بەستووە بە پێی ئەو رێکەوتنە هەر یەکێک لەوانە دەستی لە بەشێکی کەم لە ئازادییە سروشتییەکانی خۆی بۆ سەرجەم تاکەکانی گەل هەڵگرتووە بە مەبەستی زامن کردنی سەلامەتی کۆمەڵ. لەبەرئەوەی گەل بەتێکڕا ناتوانێ دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خۆی بگرێتە دەست بۆیە هەندێکیان وەکالەتیان داوە بە هەندێکی تریان بۆ هەڵسان بەم کارە لە جیاتی ئەوان.

بەم پێیە دەسەلاتەکان هی سەرجەم تاکەکانی گەلە، بەلام حاکم وەکیلی ئەوانە لەو کارەداو دەبێ بەپێی ڕێنمایی ئەوان بیبات بەڕێوە. بەم پێیە گەل سەرچاوەی گشت دەسەلاتەکانە و سەرپەرشتیارە لەسەر جێ بەجێ کردنیاندا و ناکرێ جێ بەجێ بکرێ مەگەر بۆ بەرژەوەندی گشتی نەبێت.

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردە؟ ،یت کە مرۆڤ هیچ کاتێک دەستی لە گشت مافە سروشتییەکانی هەڵنەگرتووە،

بەڵکو بە مەبەستی ڕێکخستنی کاروبارەکانی و زامن کردنی بەشێکی سەرەکی لە مافەکانی هەڵساوە بە بەستنی ڕێکەوتنێکی کۆمەلایەتی لە نێوان خۆیاندا و لەو ڕێگایەوە ویستوویەتی کاروبارەکانی خۆی لەناو کۆمەڵدا ڕێک بخات هەر بەم پێیە گەل بۆتە دوو چین چینێکیان حاکم و چینەکەی تر مەحکومین، دەبێ چینی یەکەم هەردەم لە ڕاژەی گەل کاربکات و بۆ بەرژەوەندی گشتی کار بکات ئەگینا چینی دووەم هەر کاتێک بیەوێ بۆی هەیە دەسەلاتی لێ بسێنێتەوەو کەسانێکی تر تەخویل بکات.

دەتوانین بڵێین ئەمە سەرەتای گەلالە بوونی بیرۆکەی **«گەل سەرچاوەی دەسەلاتەکانە»** کەواتە هەر وەک لە پێشەوە وتمان مرۆڤ هەر لەبەر ئەوەی مرۆڤە کۆمەڵێک مافی سەرەکی و بنەڕەتی هەن کە پێیان دەوترێ مافی مرۆڤ یان مافە سەرەکییەکان و ئازادییە سەرەکییەکان یان ماف و ئازادییە گشتییەکان کە لە سروشتەوە وەری گرتوون و پابەندی سروشتی مرۆڤایەتییەکەیەتی و بەستراوەتەوە بە کەسایەتی مرۆڤەوەو کەم کردنەوەی ئەم ماف و

ئازادییانە کەم کردنەوەیە لە کەسایەتی مرۆڤ و دەست درێژی بۆ سەر قەوارەی مرۆڤ.

ئێستا بابزانین ئەم ماف و ئازادییانە چ سوودێکیان دەبێ ئەگەر بێت و پارێزراو نەبن. لەراستیدا، هەروەک لە پێشەوە وتمان دیموکراسییەت زامنی ئەم مافانەن بە پێچەوانەشەوە لە سیستمێکی ئیستبدادی و پاشایەتی رەهادا ئەم مافانە بوونیان نییە.

بەر لە هەموو شتێ ئەم مافانە کە بە مافی سروشتیش ناو دەبردرێن هیچ بایەخێکی عەمەلیان نابێت ئەگەر نەخسترێنە ناو چوارچێوەی یاسا کە لەسەرووی هەموویانەوە دەستوور دێت.

هەر بۆیە دەستووری زۆربەی وڵاتان لەژێر چەند ناوێکی جیاجیا ئەم ماف و ئازادییانەیان رێک خستووە، ئەمەو سەرەڕای ئاماژە بۆ کردنی لە جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ کە لەساڵی ١٩٤٨ دەرچووە.

دانپیانان و بڕیار لەسەردان بۆ ئەم مافانەی مرۆڤ خۆی لە خۆیدا لە وڵاتێکی دیموکراسی نەبێ نابێت، چونکە یەکێک لەو مافە سەرەکییانە کە لە بڕگە /٣ی بەندی /٢١ی جاڕنامەی ناوبراودا هاتووە دەڵێ: **«خواستی گەل سەرچاوەی دەسەڵاتی حکومەتە، ئەم خواستەش بە شێوەی هەڵبژاردنێکی دروست و دیاریکراودا و لە سەربناغەی دەنگدانی نهێنی و یەکسانی هەموان دەردەبڕدرێ، یان بە هەر چەشنێکی دیکە کە ئازادی دەنگدان بپارێزێت»**. هەربۆیە راستیان وتووە وڵاتی دیموکراسی ئەو وڵاتەیە کە تیایدا شکۆمەندی بۆ گەل بێت بەبێ جیاوازی کردن لە نێوانیاندا، چونکە هەموویان

ئازاد و یەکسانن لە ماف وئەرکەکاندا. کەواتە دەتوانین بڵێین وڵاتی دیموکراسی وڵاتی مافە و تیایدا مافەکان لە چوارچێوەی یاسا بۆ هەمووان زامنە. یەکێک لە مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ مافی بیرورادەربڕینە کە بە گیانی بیرۆکەی دیموکراسییەت دەژمێردرێت چونکە بە هۆیەوە گەل تەعبیر لە خواست و ویستی خۆی دەکات.

ئازادی بیرورا دەربڕین بە پاڵبشتێکی سەرەکی سیستمی دیموکراسی دەژمێردرێت چونکە لە رێگای ئەم مافەوە هەموو کەسێک دەتوانێ موناقەشەی بیرورا جیاجیاکان بکات بێ ئەوەی بترسێ یان گوێ بداتە پڕوپاگەندەی قین لە دڵان تاوەکو بێ ترس و تۆقان بە راشکاوی تەعبیر لەبیرو بۆچوونی خۆی بکاتەوە.

هەر بۆیە لە کۆمەڵگایەکدا زیاتر لە رۆژنامەیەک دەبینین، هەر رۆژنامەیەکیش خوێنەری خۆی هەیەو ئەو رۆژنامەیە بەسەر رۆژنامەکانی تر تەفزیل دەکەن. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی بیرو بۆچوون. هەروەها لەناو خێزانێکیشدا سەبارەت بە چارەسەر کردنی کێشەیەکی دیاری کراو بیرو بۆچوونەکان لێک جیاواز دەبن.

مافی ئازادی بیرورا دەربڕین هەقیقەتی کۆمەڵ ئاشکرا دەکات لە رێگای بە دەرخستنی بیرۆکە شاراوەکانی دەروونی مرۆڤەوە. بەم پێیە وێنەیەکی راستەقینەی خواست و پێداویستییەکانی دەبەخشێتە دەسەڵاتی گشتی.

بۆ تەعبیر کردن لە بیرورا مەرج نییە مرۆڤ خۆی بە تاکە وەسیلەیەکی دیاریکراو ببەستێتەوە، بەڵکو بۆی هەیە بە هەر شێوەیەک تەعبیر لە بیروڕای خۆی بکات جا چی بە نووسین بێت

یان بە قسە یان بە وێنە یان نیگار یان بە جوولەیەکی دیاریکراو یان هەر وەسیلەیەکی تر.

ئەوەی شایەنی باسە، مافی ئازادی بیروڕا دەربڕین بە تەواوکەری دیموکراسییەت دەژمێردرێ چونکە لە ڕێگایەوە ئازادی گفتوگۆ و بەشدار بوونی خەڵک بە شێوەیەکی بەردەوام لە حکومەتدا هەموو کاتێک شتێکی مومکین دەبێ نەک لەکاتی هەڵبژاردنی گشتیدا بەڵکو لە هەموو کاتێکدا. جا بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ تەعبیر لە بیروڕای بکات بە هۆی ڕۆژنامە و کتێب دانان و ئیزگەو تەلەفزیۆن و سینەماو شانۆو شتی تر پێویستە ئازاد بکرێ لەو کۆسپانەی کە سنوورێک بۆ ئازادییەکەی دادەنێت.

کەواتە ڕۆژنامەی ئازاد تەعبیری ڕاستەقینەی دیموکراسییەتێکی بێ خەوشە بۆیە ئازادی ڕۆژنامە بەشێکە لە ئازادی مرۆڤی ئاسایی و نابێ سنووری بۆ دابندرێ مەگەر بە پێی یاسایەکی تایبەتی نەبێت.

دوای ئەوەی باسمان لە مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ و دیموکراسیەت و پێوەندییان بەیەکەوە کرد ئێستا لە خوارەوە باسی ئازادی ڕۆژنامەگەری دەکەین.

## ئازادی ڕۆژنامەگەری

ئازادی ڕۆژنامەگەری تەرکیز لەسەر دوو پرەنسیپی سەرەکی دەکات. یەکەمیان پێویستە ئازادی تەواو بە ڕۆژنامەنووسی بدرێ تاوەکو تەعبیر لە بیروڕاو بۆچوونەکانی خۆی بکات. دووەمیشیان پێویستە ئەو وەسیلانە بدۆزرێنەوە کە لە ڕێگایانەوە ڕێگابگیرێ



جۆن لۆك

لەبەردەم بەكارهێنانی ئەم ئازادییە لە لایەن ڕۆژنامەكانەوە وەک ئامرازێک بۆ پێشێل كردن و دەست درێژی كردنە سەر ماف و ئازادی كەسان.

كەواتە گیروگرفتی سەرەكیمان لە چوارچێوەی دیراسە كردنی ئازادی ڕۆژنامەگەریدا گیروگرفتی دۆزینەوەی هاوسەنگییەكە لە نێوان ئازادی پێویست بۆ ڕۆژنامەنووسان و مافی پێویست بۆ تاكەكانی كۆمەڵ و كۆمەڵ بە گشتی.

## یەكەم: ئازادی ڕۆژنامەنووسان

ئازادی ڕۆژنامەنووس تەنیا ئەوەندەنییە كە بواری بدرێ ئەو بیرۆكەیەی كە لەناو مێشكیدایە بیهێنێتە دەرەوە لە ڕێگای خستنەسەر كاغەزو لاپەڕەی ڕۆژنامەكان، بەڵكو ئەمە وادەخوازێ كە كۆمەڵێك توانای بخرێتە بەر دەست تا بتوانێ سوود لەو ئازادییەی وەربگرێت.

بۆیە دەبێ چاپخانەو ڕۆژنامەو كتێبخانەو دەزگاكانی چاپ و بڵاوكردنەوە ئازاد بن و نابێ كۆسپ و تەگەرەیان لەبەردەم دابندرێ بە پێی یاسا نەبێت.

هەر چەندە ئێمە باس لە ئازادی ڕۆژنامەنووس دەكەین، بەڵام ئەم ئازادییە ڕەها نییە، بەڵكو پابەندی ڕێزگرتنی مافی كەسان و بەرژەوەندی گشتی و نیزامی گشتییە حكومەت لە ڕێگای دوو

وەسیلەوە دەتوانێ سنوورێک لەبەردەم ئەم ئازادییەدا دابنێ:

### أ- سانسۆر

بە شێوەیەکی گشتی لەبارودۆخی ئاساییدا نابێ سانسۆر لەسەر ڕۆژنامە ناوخۆییەکان دابنرێ.

بەڵام لەبارودۆخی نائاساییدا حکومەت بۆی هەیە بە پێی یاساو بە فەرمانێکی ئەنجوومەنی وەزیران لەسەر داوای وەزیری ڕۆشنبیری سانسۆر بخاتە سەر گشت ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکان.

بە پێچەوانەی ڕۆژنامە ناوخۆییەکان لە بارودۆخی ئاسایشدا سانسۆر دەخرێتە سەر گشت ڕۆژنامە بیانییەکان بەر لەوەی لە کتێبخانەکاندا بفرۆشرێن.

### ب- ڕاگرتنی ڕۆژنامەکان و دەست بەسەر داگرتنیان

ئەم کارەش لە ڕێگای دادگاوە دەبێت. بۆ نموونە، داواکاری گشتی بۆی هەیە داوای ڕاگرتنی ڕۆژنامەیەک بکات بۆ ماوەیەک کە لە سێ ڕۆژ کەمتر نەبێ و لە دەرۆژیش زیاتر نەبێت ئەمەو سەرەڕای دەست بەسەراگرتنی ژمارەکانی ڕۆژنامەکەو بەرزکردنەوەی کێشەکە بۆ دادگا ئەگەر هاتوو ڕۆژنامەکە سوکایەتی بە شەرەف و کەرامەتی سەرۆکی وڵات کرد یان خەڵکی بۆ تاوان کردن هاندا وەیان فیتنە دروست بکات و ئاسایشی وڵاتەکە بخاتە مەترسییەوە.

## دووەم: مافی هاووڵاتیان و بەرژەوەندی گشتی

لەبەرامبەر دانپیانان و زامن کردنی ئەو ئازادییەی کە دراوەتە ڕۆژنامەنووسی هاووڵاتیان و کۆمەڵ بۆیان هەیە بە دوو وەسیلە

پارێزگاری لە خۆیان بکەن بەرامبەر خراپ بەکارهێنانی ئازادی ڕۆژنامەگەری

یەکەمیان لە ڕێگای دادگاوە دەبێت، دووەمیشیان بەبێ دادگا.

ڕێگا دادگاییەکە روون و ئاشکرایە، هەروەک هەموومان دەزانین بڕیاری دادگا یەک لاکەرەوەیەو هەموو کەسێک دەبێ ڕێزی لێ بگرێ.

ڕێگای دووەم کە بەبێ پەنابردنە بەر دادگا دەبێ، بریتییە لە مافی وەڵام دانەوەو مافی راست کردنەوە.

واتە لەڕێگای هەمان ڕۆژنامە یان ڕۆژنامەیەکی تر هەواڵەکە بەرپەرچ دەدرێتەوە یان راست دەکرێتەوە.

## پاراستنی ئازادی بیروڕای ڕۆژنامەنووسان

لە هەموو وڵاتێکدا ڕۆژنامە بە بەشێک لە ژیانی سیاسی ئەو وڵاتە دادەنرێ و لێی جیاناکرێتەوە. هەر وەک چۆن مافە سیاسییەکان بۆ هەموو کەسێک دانیان پیانراوە بەو سیفەتەی کە ئەو کەسە ئەندامە لە کۆمەڵگایەکی سیاسیدا بۆ ئەوەی لە ڕێگای ئەو مافانەوە بەشداری لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی وڵاتەکەی بکات هەروەها بەشداری لە نیزامی سیاسی وڵاتەکەی بکات.

ئەمەش خۆی لە خۆیدا لەگەڵ چەمکی دیموکراسیەت دەگونجێ کە ناوەرۆکەکەی ئەوەیە گەل سەرچاوەی گشت دەسەڵاتەکانە جا بۆ ئەوەی تاکەکانی گەل بتوانن تەعبیر لە ویست و ئارەزووی خۆیان بکەن دەبێ ئازاد بن لە بیروڕا دەربڕیندا، ڕۆژنامەش بە باشترین

وەسیلەوە دەتوانێ سنوورێک لەبەردەم ئەم ئازادییەدا دابنێ:

### أ- سانسۆر

بە شێوەیەکی گشتی لەباروودۆخی ئاساییدا نابێ سانسۆر لەسەر رۆژنامە ناوخۆییەکان دابنرێ.

بەڵام لەباروودۆخی نائاساییدا حکومەت بۆی هەیە بە پێی یاساو بە فەرمانێکی ئەنجوومەنی وەزیران لەسەر داوای وەزیری رۆشنبیری سانسۆر بخاتە سەر گشت رۆژنامە و بڵاوکراوەکان.

بە پێچەوانەی رۆژنامە ناوخۆییەکان لە باروودۆخی ئاسایشدا سانسۆر دەخرێتە سەر گشت رۆژنامە بیانییەکان بەر لەوەی لە کتێبخانەکاندا بفرۆشرێن.

### ب- راگرتنی رۆژنامەکان و دەست بەسەر داگرتنیان

ئەم کارەش لە رێگای دادگاوە دەبێت. بۆ نموونە، داواکاری گشتی بۆی هەیە داوای راگرتنی رۆژنامەیەک بکات بۆ ماوەیەک کە لە سێ رۆژ کەمتر نەبێ و لە دەرۆژیش زیاتر نەبێت ئەمەو سەرەرای دەست بەسەراگرتنی ژمارەکانی رۆژنامەکەو بەرزکردنەوەی کێشەکە بۆ دادگا ئەگەر هاتوو رۆژنامەکە سوکایەتی بە شەرەف و کەرامەتی سەرۆکی وڵات کرد یان خەڵکی بۆ تاوان کردن هاندا وەیان فیتنە دروست بکات و ئاسایشی وڵاتەکە بخاتە مەترسییەوە.

## دووەم: مافی هاووڵاتیان و بەرژەوەندی گشتی

لەبەرامبەر دانپیانان و زامن کردنی ئەو ئازادییەی کە دراوەتە رۆژنامەنووسی هاووڵاتیان و کۆمەڵ بۆیان هەیە بە دوو وەسیلە

**یان بۆ ئەوی؟».**

هەروەها جیمس رستون وتەیەکی بە هەمان مانا هەیە و دەڵێ:
**«ئەگەر بێت و بە چاوێکی پۆلیسی سەیری هەڵس و کەوت و کاری رۆژنامەنووسان بکەین لەوانە بوو بەبێ ئیستثناء تۆمەتی سیخوڕی بۆ بیگانە بخرێتە پاڵ گشت رۆژنامەنووسێک.»**

کەواتە بۆ ئەوەی رۆژنامەنووس ئەم گومانەی لێ نەکرێ و تۆمەتی نەخرێتە پاڵ، پێویستە یاسایەک هەبێ پیشەکەی رێک بخات و رۆژنامەنووسیش بپارێزێ.

## رۆژنامەگەری و دەسەڵاتی چوارەم

هەر وەک لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد لە ئەنجامی بیرۆکەی رێکەوتنی کۆمەڵایەتی لە چاخەکانی ناوەڕاست و لێکدانەوەی لە لایەن هزرمەندان بە تایبەتی هزرمەندی فەرەنسایی جان جاک رۆسۆ گەل بە سەرچاوەی گشت دەسەڵاتەکانی وڵات داندرا.

هەروەها بۆ رێکخستنی پێوەندی نێوان ئەم دەسەڵاتانە و رێگاگرتن لەبەردەم دەست بەسەراگرتنی ئەم دەسەڵاتانە لەلایەن حاکمە دکتاتۆرو (متسلط)ەکانەوە هزرمەندی فەرەنسایی مۆنتسکیۆ پرەنسیپی «لێک جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان»ی دۆزییەوە...

دوا بە دوای ئەویش لە لایەن هزرمەندی یۆنانی ئەفلاتون و ئەرستۆ بایەخی پێ دراو روونیش کرایەوە کە دەبێ لە هەر وڵاتێکدا دەسەڵاتەکان بەسەر چەند دەستەیەک دابەش بکرێ کە ئیمڕۆ ئێمە

ناومان ناون بە دەسەلاتی یاسادانان و دەسەلاتی جێ بەجێ کردن و دەسەلاتی دادگا هەروەها ئەم دوو هزرمەندە وتیان کە دەبێ هاوسەنگییەک لە نێوان ئەو دەسەلاتانەدا هەبێ بۆ ئەوەی یەکێکیان تاک رۆیی نەکات لە حوکمدا کە رەنگ بێت ببێتە هۆی بەرپابوونی شۆڕش لە دژی ئەم تاک رۆییە.

کەواتە سەرهەڵدانی بیرۆکەی دانانی رۆژنامە بە دەسەلاتی چوارەم لەولاتدا پێوەندی بە بیرۆکەی رێکەوتنی کۆمەلایەتی و سەرهەڵدانی سیستمی دیموکراسییەت و دۆزینەوەی پرەنسیپی لێک جیا کردنەوەی دەسەلاتەکانە.

ئەوەی شایەنی باسە، لە ئەنجامی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی و فراوان بوونی دەسەلاتی حکومەت و زۆر بوونی پێوەندییە کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری و... تاد لەناو کۆمەڵدا بیرۆکەی دانانی رۆژنامە بە دەسەلاتی چوارەم سەری هەڵدا چونکە رۆژنامە بە باشترین وەسیلە دادەندرێ لە وەسیلەکانی تەعبیر کردنی مرۆڤ لە بیروراکانی و بە هۆی رۆژنامەوە دەتوانێ ئەو بیرۆکانەی کە لەناو مێشکیدا پەنگیان خواردۆتەوە بیانخاتە سەر کاغەزو لەبەر دەستی حاکم و گەلی دابنێت و ئەمەش دەگونجێ لەگەڵ پرەنسیپی گەل سەرچاوەی دەسەلاتە چونکە دەسەلاتداران (حکام) لە سیستمی دیموکراسیدا نوێنەری گەلن و دەبێ تەعبیر لە بیروڕای گەل بکەن.

کەواتە پێوەندی نێوان گەل و دەسەلاتداران بە کۆتایی هاتنی هەڵبژاردنی گشتی کۆتایی پێ نایەت، بەڵکو دەبێ ئەم پێوەندییە هەر بەردەوام بێت و لە رێگای کەناڵە جیاجیاکانەوە تاکەکانی گەل

تەعـــبـيـــر لە بـيـــروڕای خـــۆيـان بكەن و دەسەڵاتدارانيش ئاگاداری ئەو بيروڕايانەبن و فەرامۆشيان نەكەن.



تۆماس هۆبز

دوای ئەوەی بيرۆكەيەكمان لەبارەی هەر چوار دەسـەڵاتەكـانەوە پێشكەش كـرد، با بزانين ئايا دەكـرێ لە رووی ياسـايـيـەوە رۆژنامـەگـەری بە دەسـەڵاتی چوارەم دابنێين يان نا ؟

ئايا رۆژنامـەگـەری كـوردی توانـيـويەتی ببێ بەو دەسەڵاتی چوارەمە يان نا ؟

بەر لە هەمـوو شـتـێـك تا رۆژنامـەگەری ببێـتـە دەسـەڵاتی چوارەم لەوڵاتدا دەبێ ئازاد بێت.

لەبەر ئەوەی دەركردنی رۆژنامـەيەك يان گۆڤارێك پێويستی بە توانايەكی دارايی و هونەری زۆر هەيە كـە رەنگ بێت بە ئاسـانی لای گـشت كـەسـێك و عـمـومی خەڵكی نەيەتەدی، بۆيە دەبينين گرووپ و پارتە سياسيـيەكان و كەسايەتييە خاوەن دەسەڵاتەكان و دامودەزگا گشتـيـيەكانی حكومەت كاروباری رۆژنامەگەرييان گرتۆتە ئەسـتـۆ بە هۆی توانای دارايی و هونەرييـانەوە، هەر بۆيە دەبينين زۆربەی هاووڵاتيـان دەكـەونە ژێر كـاريگەرێتی فـيكری ئەو خـاوەن دەزگا رۆژنامەگەرييانەوە..

هەر لەبەر ئەمەشە، حكومەت سنوورێك بۆ ئازادی رۆژنامەگەری دادەنێت و لە رێگای سانسۆرەوە بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی

گشتی لەکاتی پێویستدا.

پێش بەرپا بوونی شۆڕشی ساڵی ١٩٥٢ لە میسردا گەلێک ڕۆژنامە دەرچوون، بەڵام هەر یەکێک لەو ڕۆژنامانە پشتی بە دەسەڵاتی لایەنێک بەستبوو و تەعبیریشی هەر لەو لایەنە دەکرد. بۆ نموونە لایەنی بەریتانیا و کۆشکی پاشایەتی و ڕای گشتی.

بەڵام شۆڕشی میسری یەک دەسەڵاتی هێنا ئاراوە کە تەعبیر لەویستی گشتی لەو قۆناغەدا بکات.

هەروەها ئەگەر چاوێک بە ساڵانی پێشووی لوبنان بخشێنین دەبینین گەلێک ڕۆژنامەی جۆراو جۆری تیابووە هەر وەک ئێستای کوردستانی لای خۆمان کە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زۆری و جۆراو جۆری سەرچاوەی دارایی ئەو ڕۆژنامانە هەر بۆیە ئەگەر بە سەتحی سەیری ئەو دیاردەیە بکەین دەبینین جموجۆڵێکی ڕۆژنامەگەری هەمەرەنگی فیکری هەیە لەو وڵاتەدا. کەچی سەرەڕای ئەمەش ڕۆژنامە ئازاد نەبوو، بەڵکو تەعبیریان لەو هێزانە دەکرد کە لە گۆڕەپانی لوبنان کاریان دەکرد و کردبوویانە مەڵبەندی گۆڕەپانی ململانێی وڵاتە عەرەبییەکان.

**هەر بەم بۆنەیەوە جەمال عەبدول ناسر دەڵێ: «لە لوبناندا ئازادی ڕۆژنامەگەری هەیە، بەڵام ڕۆژنامەی ئازاد نییە».**

بە هەر حاڵ، سەبارەت بە دانانی ڕۆژنامەگەری بە دەسەڵاتی چوارەم دەتوانین بڵێین پابەندی سیستمی دیموکراسییە، بەڵام ئەمەش بەس نییە تا ببێتە ئەو دەسەڵاتە، بەڵکو پێویستە وەک سێ دەسەڵاتەکەی تر دەسەڵاتی یاسا دانان و جێبەجێ کردن و دادگا لە

دەستووری وڵاتدا پەسند بکرێت و ڕێک بخرێت و پێوەندیشی لەگەڵ سێ دەسەڵاتەکەی تردا دیار بکرێت.

چونکە نەک ڕۆژنامەگەری وەک دەسەڵاتی چوارەم تەنانەت هەر سێ دەسەڵاتەکەی تریش ئەگەر دەستوور پەسندیان نەکات و ڕێکیان نەخات هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نابێت، هەروەها ماف و ئازادییە گشتییەکان کە ئازادی بیروڕا دەربڕین و ئازادی ڕۆژنامەگەریش یەکێکە لەو ئازادییانە ئەگەر دەستوور بڕیاریان لەسەر نەدات هەر وەک مافێکی سروشتی دەمێننەوەو هیچ زەمانەتێک بۆ پڕۆسەکردنیان نابێت.

بۆیە بە واتایەکی یاسایی تا ئێستاکە ڕۆژنامەگەری لە هیچ وڵاتێک دانی پیانەنراوە وەک دەسەڵاتێکی چوارەم. بەڵام دەکرێ بە واتایەکی سیاسی پێی بڵێین دەسەڵاتی چوارەم هەروەک چۆن ئێستاکە لە زۆربەی وڵاتانی دنیایەوە بەو دەسەڵاتە ناوبراوە.

بۆ نموونە، چۆن هەر سێ دەسەڵاتەکەی تر چاودێرن بەسەریەکەوە بۆ ئەوەی یەکێکیان تاک ڕۆیی نەکات لە حوکمی وڵاتدا هەر ئەوهاش ڕۆژنامەگەری وەک دەسەڵاتێکی چوارەم و سەربەخۆ ئەم ڕۆڵەی بینیوەو کاریگەر بووە لەسەر سێ دەسەڵاتەکەی تردا و توانیویەتی ڕای گشتی دروست بکات هەروەها وەک چاودێرێک زۆر جار حکومەت وشیار دەکاتەوە، هەروەها حکومەتیش ئەو وشیار دەکاتەوە. کەواتە حکومەت و ڕۆژنامەگەری تەواوکەری یەکترن و هەر دووکیان پێویستییان بەیەک هەیە.

نموونەی دەسەڵاتی ڕۆژنامەی ئازاد لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکاندا زۆرە لەوانە بڵاوکردنەوەی کێشە ئابڕوبەرەکەی (وترگیت) لە لایەن

ڕۆژنامـەکـانی وڵاتە یەکگرتووەکـانی ئەمـەریکا کـە ڕووبەڕووی فـەرمـانبەرانی کۆشکی سپی و سەرۆکی ئەمەریکی نیکسـۆن کرا.
هەروەها بڵاوکردنەوەی زانیاری لەبارەی پێوەندی سێکسی لە نێوان سەرۆکی ئێستای ئەمەریکی کلینتۆن و خانم مۆنیکا لوینسکییەوە.
. هەروەها تـاوانبـار کـردنی سـەرۆک وەزیرانی پێـشـووی ئیتـاڵـیـا بە ئەندامێتی مـافـیـای ئیـتـاڵـیـاو بڵاوکردنەوەی زانیاری لـەسـەریدا لە ڕۆژنامـەکـانی ئیـتـاڵـیـاو جـیـهـاندا. کـەواتە لێرەدا ئەوەمـان بۆ دەردەکـەوێ کـە تا چ ڕادەیەک ئازادی ڕۆژنـامـەگـەری پابەندی سیـسـتـمی دیموکراسیـیـەتە لەو وڵاتانەدا دەتوانێ ڕۆڵی خۆی ببینێ وەک چاودێرێک بەسـەر گشت دامو دەزگـاکـانی حکومـەت، بەڵام سـەبارەت بە ڕۆڵی ڕۆژنامـەگـەری کـوردی لەم ڕووەوە-واتە وەک دەسەڵاتی چوارەم- دەتوانین بڵێین هێشتان زووە باس لەو مەسەلەیە بکەین چونکە ئێمە تا ئێستا بە تەواوەتی لە مانای دیموکراسییەت نەگەیشتووین و تازە هەندێ لایەنی ئەم سیسـتـمە بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانمان پەیڕەو دەکەین.
هەروەها تا ئێستـا لە کـوردسـتـان تاکە ڕۆژنامەیەکی ئازاد بە مانای وشە دەرناچێت، بەڵکو ئەوانەی هەن هەر هەمـوویان لەلایەن پارت و ڕێکخراوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانەوە دەردەچن و بە تەواوەتی پشت ئەستوورن بە دارایی ئەو لایەنانەوە و تەعبیریش لەویست و ئارەزووی ئەوان دەکەن نەک ئەو کەسانەی کە تیایدا کاردەکەن و دەری دەهێنن وەیان ویست و ئارەزووی میللەت.
هەروەها ڕۆژنامەنووسانیشمان بوونەتە پاشکۆی ڕۆژنامەکان و ئەوانیش ئازادنین. هەر ئەمە وای کردووە ڕای گشتی لە کوردستان

دروست نەبێت، چونکە رای گشتی پابەندی ئازادی بیرورا دەربڕینە، کە رۆژنامەش باشترین وەسیلەیە بۆ تەعبیر کردن لەو بیروڕایانەدا.
لەکۆتاییدا دەڵێین ناکرێ باس لە مەسەلەی ئازادی رۆژنامەگەری و رۆژنامەنووسان بکەین ئەگەر لە دەستووردا دان بە سیستمی دیموکراسییەت و پرەنسیپی لێک جیا کردنەوەی دەسەڵاتەکان نەنێین.

## سەرچاوەکان:

١- د. صبحي المحمصاني - اركان حقوق الانسان- دار العلم للملايين - بيروت- ط / ١- ١٩٧٩.
٢- د. ضاري خليل محمود - الاجتهاد وحقوق الانسان في الاسلام - دار الشؤون الثقافية العامة - العراق- ١٩٩٦.
٣- جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ - ئەنستیتۆی کورد لە پاریس ساڵی ١٩٩٢.
٤- محمد حسنين هيكل - بين الصحافة والسياسة- شركة المطبوعات للتوزيع والنشر - بيروت- ١٩٨٥.
٥- د. منذر الشاوي - مذاهب القانون - دار الحكمة - بغداد ١٩٩١.
٦- د. محمد سعيد مجذوب- الحريات العامة- حقوق الانسان- جروس برس - لبنان ١٩٨٦.
٧- کەمال سەعدی - حقوق المؤلف - اربيل - ١٩٩٧.
٨- کەمال سەعدی - یاساوماف - اربيل- ١٩٩٧.
٩- کەمال سەعدی - محاضرات في تاريخ القانون - كلية القانون

والسياسة – ١٩٩٧ /١٩٩٨.
١٠- د. ابو اليزيد علي المتيت – النظم السياسية والحريات العامة- ط/ ٣- الناشر مؤسسة شباب الجامعة ١٩٨٢ الاسكندرية.
١١- د. عبدالغني بسيوني عبدالله – النظم السياسية (الدولة – الحكومة- الحقوق والحريات العامة) الناشر الدار الجامعية – ١٩٨٥.
١٢- د. ابدوريا A. APPADORAI- المدخل الى العلوم السياسية- النظريات الاساسية في نشأة الدولة – ترجمة نوري محمد حسين – بغداد- ١٩٨٨.
١٣- د. ملحم قربان – قضايا الفكر السياسي – الحقوق الطبيعية- المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع – بيروت ١٩٨٣.
١٤- د. محمد سعيد مجذوب – الحريات العامة وحقوق الانسان- جروس برس – لبنان- ط/ سنة ١٩٨٦.
١٥- د. محمد كاظم المشهداني – النظم السياسية – وزارة التعليم العالي والبحث العلمي – العراق – ١٩٩١.
١٦- دەستووری عێراق ساڵی ١٩٧٠
١٧- پرۆژەی دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٩٠.
١٨- انكس كولدر Angus Galder – الحرب والاعلام والآداب والفنون – ترجمتها عن الانكليزية سمير عبدالرحيم الجلبي- مجلة الثقافة الاجنبية – تصدرها وزارة الثقافة والاعلام العراقية – العدد/ ٢ لسنة ١٩٨٧.
١٩- د. عبدالرحمن رحيم عبدالله – الترابط العضوي بين الديمقراطية وحقوق الانسان – گۆڤاری کاروانی ئەکادیمی (بەشی عەرەبی) ژمارە (٢) بەرگی یەکەم ساڵی ١٩٩٧.



## نووسەر لەچەند دێرێکدا

- لە ساڵی ١٩٥٦ لەشاری هەولێر لەدایک بووە.
- لە ساڵی ١٩٨٨/١٩٨٩ کۆلێژی یاسای لە زانکۆی سەلاحەددین تەواوکردووە و بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە یاسا وەرگرتووە.
- لە ١٩٩٦/٥/٢١ بڕوانامەی ماجستێری لە یاسا لەنامەی «**حق الملكية الادبية و الفنية في القانون العراقي والمقارن**» لە کۆلێژی یاساو رامیاری لە زانکۆی سەلاحەددین وەرگرتووە.
- قوتابی دکتۆرایە لە «**معهد التاريخ العربي والتراث العلمي**» لەبەغدا

## بەرهەمە بڵاوکراوەکانی:

- شەش کورتە چیرۆکی کوردی - هاوبەش - ١٩٧٦.
- وون بوون - چیرۆک -١٩٨٤.
- دەرگا - چیرۆک -١٩٩٠.
- لێکدانەوەی یاسای بەکرێدان - ١٩٩١.
- سایکۆلۆژیای هونەری منداڵان - ١٩٩٠.
- سەعید زەبۆکی لای خۆمان - رۆمان - ١٩٩٧.
- چەمکی ماف - چاپی یەکەم - ١٩٩٧.
- یاساو ماف - ١٩٩٧.
- حقوق المؤلف - ١٩٩٧.
- هونەری منداڵان - ١٩٩٨.
- چەمکی ماف - چاپی دووەم - ١٩٩٨.
- دەسەلاتی چوارەم - ١٩٩٨.

ژمارەی سپاردن (١٤٢) ساڵی ١٩٩٨ چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری- هەولێر